ئەبولوئلوئەی مەجووسیەوە شەهید بکرێ چاوم پێی کەوت تەشـــریفی بەســـەر حوذەیفەو عوثمانی کوڕی حونەیفەوە ـ رضي الله تعالى عنهما ـ وەستابوو فەرمووی: چیتان کرد ؟ ئەترسن لەوەی کە ئەوەندەتان خەرج لەسەر ئەرزی عیراق دانابێ کـە ئەرزەکە هەڵی نەگرێ ؟ عـەرزیانکـرد : خـەیـر ئەوەندەمان خەرج لەسەر دانا کە هەڵی بگرێ ، زۆر زیادمان دانـەنـاوە ، دووبارە فەرمووی : تێفکرن زیادتان لەسەر نەنووسیبێ • عەرزیانکردەوە : خەیر • ئیمامی عومەر ـ رضي الله تعـالى عنـه ـ فەرمووی : ئەگـەر خـوا سەلامەتم بکا ئەرامیلی[1] ئەهلی عیراق ئەوەندە ئەخەمە روفاهییەتەوە وایان بەجێ بێلم کە دوای من موحتاج نەبن بە هیچ کەس بە ئەبەد • هـەر چوار رۆژی بەسەرا رابورد کە تووشی ئەو موصیبەتە بوو • [ لە حەقیقەتـا ئـەو تووشی موصیبەت نەبوو ، تائیلی فەضیلەتی شەهادەت بوو ، ئیســـلام گرفتاری فیتنەو فەسادی ••• دوای ئـەو شـێری غەڕایەو عادیلە کەوتنـە ذیللەتو ئەسارەتەوەو خێریان نەبینی ] •

عەمری کوڕی مەیموون ئەڵێ : [ لە مزگەوتا بۆ نوێژ ] راوەســـتا بووم ، لە بەینی منو عومەرا تەنها ئیبنوعەباس بوو ـ رضي الله تعالى عنهم ـ لە نوێژی سبەینێی ئەو رۆژەدا بوو ، عادەتی عومەر ـ رضي الله تعالى عنه ـ وابوو کـە بـە بەینی صـــەفەکانا رائەبورد تـا صـــەفەکان راستەبۆوە خـەلـەل لـە بـەینیـانـا نـەئـەمـا ئـەیفـەرموو : راســـتبنەوە ، ئـەو وەختـە تـەشـــریفی پێشـــەکەوتو ( الله أكبر )ی ئەکـرد ، زۆر جـار لـە رکاتی ئەووەڵا ســـوورەتی ( یوســـف ) یـا ( نحـل ) یـا سوورەتێکی وەك ئەوانەی ئەخوێند ، بۆ خاتری ئەمە کە خەڵق کۆبنەوەو بە رکاتی ئەووەڵا بگەن ، هەر ئەوەندە بوو کە ( الله أكبر )ی کـرد گوێم

---

(١) بێوەژنانی عیراق .

لێبوو ئەیفەرموو : سەگ کوشتمی ، یا فەرمووی : سەگ خواردمی ، پیاوە بە قووەتە مەجووسییەکە بە کێردێکی دووسەرەوە وەك طەیر رفیو بە لای هەرکەسێکا ئەڕۆیی بە راستەو چەپەدا ئەو کێردەی لێ ئەدا تا سێنزە کەسی بریندار کرد ، حەوت یا نۆیان وەفاتی کرد • [ کولەیبی کوڕی کەبیری لەیثی صەحابی ـ رضي الله تعالى عنه ـ یەکێ بوو لەوانە کە وەفاتی کرد ] پیاوێ لە موسوڵمانان [ کە حەططانی تەیمی موهاجیر بوو ـ رضي الله تعالى عنه ـ ] کە چاوی بەوە کەوت قەلەنسوەیێکی درێژی بەسەرەوە بوو دای بەسەر ئەو پیاوە مەجووسییەدا ، کە مەجووسییەکە تێیگەیی کە گیرراوەو خەلاصی نیە بەو کێردە خۆیی کوشت •

ئیمامی عومەر ـ رضي الله تعالى عنه ـ دەستی عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوفی گرت ـ رضي الله تعالى عنه ـ پێشی خست ، ئەوانەی کە لە دەورو پشتی ئیمامی عومەرا بوون ـ رضي الله تعالى عنه ـ چاویان بەوە کەوت کە من دیم فەقەط ئەوانەی کە دوور بوون لێیو لە ئەطرافی مەسجیدا بوون نەیانئەزانی ، هەر ئەوەندە بوو دەنگی ئیمامی عومەر ـ رضي الله تعالى عنه ـ یان نەبیست دەستیانکرد بە ( سبحان الله ، سبحان الله ) عەبدوڕەحمان ـ رضي الله تعالى عنه ـ نوێژێکی خەفیفو کورتی پێکردن ، کە لە نوێژ بوونەوە ئیمامی عومەر ـ رضي الله تعالى عنه ـ بە ئیبنوعەباس ـ رضي الله تعالى عنه ـی فەرموو : بچۆ تێفکرە بزانە کێ منی کوشتوە ؟ تەشریفی چوو قەدەری گەڕاو هاتەوە عەرزیکرد : ئەبولوئلوئەی غولامی موغیرە بوو • فەرمووی : ئەو صەنعەتکارە حاذیقەکە[1] ؟ فەرمووی : بەڵێ • ئیمامی عومەر ـ رضي الله تعالى عنه ـ فەرمووی : خوا بیکوژێ من هەر بە چاکی ئەمرم پێکرد • یەعنی هیچ ظوڵمو تەعەددیم لێ نەکرد ( الحمد لله ) خوا منی

(١) وریاو دەسترەنگینو زرنگ •

به دەستی یەکێ لە موسوڵمانان نەکوشت [ به دەستی مەجووسییەك کوشتمی ] ئیمامی عومەر ـ رضي الله تعالى عنه ـ به ئیبنوعەباس ـ رضي الله تعالى عنهما ـی فەرموو : تۆو باوکت حەزتان ئەکرد کە مەجووسی لە مەدینەدا زۆر بن • عەبباس لە هەموو ئەهلی مەدینە عەبدی زۆرتر بوو • ئیبنوعەباس ـ رضي الله تعالى عنه ـ عەرزی ئیمامی عومەری کرد ـ رضي الله تعالى عنه ـ : ئەگەر ئیرادە ئەفەرمووی : هەر عەجەمییێ لە مەدینەدا هەن ئەیانکوژین • فەرمووی : درۆتکرد ، لە دوای ئەمە کە بە زمانی ئێوە قسەیانکردو ، بەرەورووی قیبلەی ئێوە نوێژیانکردو ، حەجی ئێوەیان کرد موسوڵمانن ، موسوڵمان چۆن ئەکوژرێ •

[ سەبەبی ئەوە ئەمەیە ئیمامی عومەر ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئیذنی نەئەدا کە ئەسیر ، پیاوەکانیان ، بێنرێنە مەدینەوە ، هەر ژنەکانیان ئەهاتن • حەتتا عەبباس ـ رضي الله تعالى عنه ـ عەرزیکرد : ئیشی مەدینە گرانە ، هەر بە مەجووسیی پێك یێ چونکی صنعەتکارن • عەمری کوڕی شوعبە ( عن ابن سیرین ) ] •

[ موغیرەی کوڕی شوعبەیش ـ رضي الله تعالى عنه ـ لەو وەختەدا ئەمیری کووفە بوو بۆی نووسی : غولامێکی صنعەتکارم لایە ، گەلێ ئیش ئەزانێ کە فائیدەی بێ بۆ موسوڵمانان ، ئاسنگەرە ، نەققاشە ، دارتاشە ••• ئیذنی بدە بۆ مەدینە • ئیذنی دا مانگی صەد دینار خەرجی لەسەر دانا ، شکایەتی لە خزمەت ئیمامی عومەرا کرد کە خەرجەکەم گرانە • فەرمووی : خەرجەکەت بە نیسبەت دەستکەوتنتەوە زۆر نیە • بە رقەوە گەڕایەوە ، چەند شەوێکی بەسەرا رابورد لە پاشا ئەو عەبدەی بەلادا رۆیی فەرمووی : بیستوومە کە ئەڵێی هەوەسم بێ ئاشێ دروست ئەکەم کە بە با بگەڕێو شت بهاڕێ ؟ بە روویەکی گرژەوە رووی تێکردو

عەرزی‌کرد : ئاشێکی وات بۆ دروست ئەکەم کـە هەموو خەڵق لـە بەینی خۆیانا قسەی لێ بکەن ، بە ناوبانگ بگێڕرێتەوە • ئیمامی عومەر ـ رضي الله تعالى عنه ـ رووی‌کردە ئەوانەی کە لە خزمەتیا بوون فەرمووی : ئـەم عەبدە هەڕەشەم لێ ئەکا • لە پاشا ئەبولوئلوئە خەنجەرێکی دوو سـەری هەڵگرت ، مستووەکەی لە ناوەڕاستەوە بوو ، لە گۆشەیێکی مزگەوتەکەدا لە تاریکی شەوا خۆی پەنادا تا ئیمامی عومەر ـ رضي الله تعالى عنه ـ بـۆ خەڵقی خەبەردارکردنەوە تەشریفی چوە دەرێ ؛ چونکی عادەتی وابـوو • کە گەیی‌یە لای ئەبولوئلوئەو لێی نزیك بۆوە سێ خەنجەری بەو خەنجەرە لێدا • یەکێکی لـە خوار ناوکیەوە بوو پێستو گۆشتی زکی کونـاودەر کـردبـوو چووبوو بـە نـاو زگیا ، بەو برینە وەفاتی کــرد • لـە مەتنی حەدیثەکەدا ئەڵێ : دوای ( الله أكبر )کردن لێی‌دا • مونافاتیان نیە ، یەعنی لێی‌نزیك بۆوە ئەمجا چوە میحرابـەکـەوە ( الله أكبـر )ی کــرد ئەمجـا خەنجەرەکەی لێدا • لە ریوایەتی ئیبنوسەعدا لـە ئیبنوعومەرەوە ـ رضي الله تعالى عنه ـ بەحث لە تەکبیری تەرك کردوە ] •

عومەریان ـ رضي الله تعالى عنه ـ هەڵگرت بردیانە ماڵێ ، ئێمەیش لە خزمەتیا چووین • خـەڵـق قەت موصـــیبەتێکی وا گەورەیـــان تووش نەبووبوو • [ لەو وەختەوە هەر موصیبەتێ بەسەر ئیسلاما هاتبێ لە ئاثاری ئەو موصیبەتەیە ؛ چونکی بوو بە مانیعی فوتووحاتو سەبەبی ئیختیلافو نەشری ئیسلام ] بەعزێ لە خەڵق ئەیانوت : برینەکانی زەرەری نیە ، بەعزێ ئەیـانـوت : لێی ئەترسم • لـە بەر ئـەوە نەبیذیان[1] داێ ، خواردیەوە نەبیذەکە [ بە خوێنەوە ] لە برینەکەی هاتەدەرێ [ نەیانزانی کە خوێنـە یـا

---

(1) نەبیذ : دۆشاو ، خۆشاو .

نەبیذەکەیە ] هاتن شیریان دایێ شـــیرەکە [ بـە سپێتی ] لـە برینەکەوە هاتەدەرێ ، ئەو وەختە زانییان کە وەفات ئەکا ٠

ئێمەیش چووینە ژوورەوە خزمەتی ٠ خەڵق هاتن ثەنایان لەسەر ئەکرد کوڕێکی جوانکە لە ئەنصار هاتە خزمەتی عەرزیکرد : ( یا أمیر المؤمنین ) موژدەبێ بە موژدەیێکی گەورە : صوحبەتی پێغەمەرت هـەیـە ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ ، لە ئیسلامەتیدا شەرەفو فەضلت هەیە ، ئەو شەرەفو فەضلەی کـە ئەیزانی ، لـە دواییا بووی بـە خەلیفە عەدالەتت بەجێهێنا ، نائیلی مەرتەبەی شەهادەت بووی ٠ فەرمووی : حەزەکەم ئـەوە کیفایەتم ئەوەندە بۆ بکا نە لە ( لە )م بێو نە لـە زمرەرم بێ ! کـە ئەو جوانکەیـە پشتیهەڵکرد داوێنی ئیزارەکەی لە ئەرز ئەخشـا ٠ ئیمامی عومەر ـ رضي الله تعالی عنه ـ فەرمووی : ئەو غولامەم بۆ بگێڕنەوە ، پێی فەرموو : ئەی کوڕی برای خۆم داوێنی جلەکەت لە ئەرز هەڵگرە ٠ بۆ جلەکەیشـــــت چاکە درەنگ ئەدڕێ ، بۆ تەقوایشت لـە حوضووری خوادا ـ عز وجل ـ باشـــە ٠

لە پاشا فەرمووی : ئەی عەبدوڵلای کوڕی عومەر تێفکرە چەنـدەم قەرز لەسەرە ؟ حیسابیانکرد هەشتاو شەش هەزار یا نزیك لـەوە [ ظاهیر وایە دینار بێ ] = ی لەسەر بوو = فەرمووی : ئەگەر ماڵی ئـالی عومـەر کیفایەتی کرد باشە لە ماڵی ئەوان بیدەرەوە ٠ ئەگەر کیفایەتی نەکـرد لـە ماڵی بەنی عەدیی کوڕی کەعب [ کە عەشیرەتی ئـەو بوون ] بیـدەرەوە ، ئەگەر ماڵی ئەوانیش کیفایەتی نەکرد لە قورەیش داوا بکە ، لەوان تەجاوز مـەکـە بۆ غەیری ئەوان ، ئـەو ماڵـەم لـە بـاتی بدەرەوەو بیخەرە نـاو ( بیت المال )ی موسوڵمانانەوە [ عەبدوڕەحمانی بنی عەوف ـ رضـــي الله تعالی عنه ـ لێیپرسی : ئەوەندە پارەیەت چی لێکردوە ؟ فەرمووی : لـەو

حەجانەدا کە کردوومەو ، لەو حادیثانەدا کە رووی‌داوە صەرفم‌کردوە •
جابر عند أبي عمر ] •

لە پاشا ئەمری فەرموو بە عەبدوڵڵای کوڕی ـ رضي الله تعالی عنه ـ :
بچۆرە خزمەت حەزرەتی عایشە ـ رضي الله تعالی عنها ـ عەرزی‌بکە کە
عومەر سەلامت لێ ئەکا ، مەڵێ ( أمير المؤمنين ) چونکی ئیمڕۆ من ئەمیری
موئمینان نیم • بڵێ : عومەری کوڕی خەطاب ئیذنت لێ طەلەب ئەکا کە لە
خزمەت رەفیقەکانیدا [ کە پێغەمەرە ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـو ئەبوبەکر
ـ رضي الله تعالی عنه ـ ] دفن بکرێ • عەبدوڵڵا ـ رضي الله تعالی عنه ـ
تەشریفی چوە خزمەتی حەزرەتی عایشە ـ رضي الله تعالی عنها ـ سەلامی
لێ کردو ئیذنی لێ خواست کە بچێتە خزمەتی [ ئیذن‌دراو ] چوە ژووری
لای ، تێفکری تەشریفی دانیشتبو ئەگریا • عەرزی‌کرد : کە عومەری
کوڕی خەطاب سەلامت لێ ئەکاو ئیذنت لێ‌ئەخوازێ کە لە خزمەت
رەفیقەکانیا دفن بکرێ ، فەرمووی : ئەو جێیەم بۆ خۆم دانابوو ، ئیمڕۆ
ئەو تەرجیح ئەدەم بەسەر خۆما • کە عەبدوڵڵا ـ رضي الله تعالی عنه ـ
تەشریفی گەڕایەوە عەرزی ئیمامی عومەر ـ رضي الله تعالی عنه ـکرا کە
ئەوە عەبدوڵڵایە هاتەوە ، فەرمووی : هەڵم‌گرن ، پیاوێ [ ئیبنوعەباس بو
ـ رضي الله تعالی عنه ـ ] پاڵی دا بە خۆیەوە ، فەرمووی : چیت‌لایە ؟
عەرزی‌کرد : ئەوەی کە ئەیحوبێتی ( يا أمير المؤمنين ) ئیذنی دا •
فەرمووی : ( الحمد لله ) هیچ شتێ لە لام لەوە موهیمتر نەبوو [ ئەی
عەبدوڵڵا ] کە موددەم تەواو بوو هەڵم‌بگرن بۆ لای حوجرەی سەعادەت ،
لە پاشا سەلامی لێ بکە ، عەرزی‌بکە : کە عومەری کوڕی خەطاب
ئیستیذان ئەکا ، ئەگەر ئیذنی‌دام بمبەنە ژوورێ ، ئەگەر رەدی کردمەوە

بمگێڕنەوە بۆ مەقبەرەی موسوڵمانان [ مەبادا ئیذنی پێشـــووی چونکی ئێشتا لە حەیاتا بووم لە ڕوو دامابێ‌و لە پاشا پەشیمان بوو بێتەوە ] .

ئوممولموئمنین حەفصە ـ رضي الله تعالى عنها ـ ژنانی لە خزمەتا بوو ، تەشریفی هات کە چاومان پێی‌کەوت هەڵساین ، ئەو تەشریفی هاتەژووری خزمەتی تا ساعەتێ لە خزمەتیا بوو گریا ، پیاوانی تر هاتن ئیستیذانیان کرد حەزرەتی حەفصە ـ رضي الله تعـالى عنهـا ـ تەشریفی چوە ژوورێکی تر ، گوێمان لە ژوورەوە لە گریانی بوو .

ئەو پیاوانەی کە هاتنە خزمەتی عەرزیان‌کرد : کە ( یا أمیر المؤمنین ) وەصیەت بکە یەکێ بکە بە خەلیفە . فەرمووی : بۆ خەلافەت لەو شـەش کەسە زیاتر بە موستەحقتر نازانم کە پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ وەفاتی‌کردو لێیـان رازی بـوو . ناوی : عـەلی‌و ، عوثمان‌و ، زوبەیرو ، طەلحەو ، سەعدو ، عەبدوڕەحمانی برد ـ رضي الله تعالى عنهم ـ عەبدوڵڵای کوڕی عومەریش لاتان حازر بێ ، فەقەط ئەو لـە ئەمری خەلافەتـا هیـچ حیصصەی نەبێ . بەم فەرموودە ( کأنە ) تەعزیەی لە عەبدوڵڵا کرد کە بـە تەمای هیچ نەبێ . فەرمووی : ئەگەر لە ئینتیخابا سەعد کرا بە خەلیفە ئەوە ئەهلە بـە خەلافـەت ، ئەگەر نەکرا بـە خەلیفـە ئـەوی ئەبێ بـە خەلیفـە ئیستیعانەی پێ بکا ، من بۆیێکم عەزل نەکرد کە عاجز بێ لـە سیاسەتا یـا خیانەتێکی کردبێ . هەم فەرمووی : وەصیەت ئەکەم بەوەی کە لە دوای من ئەبێ بە خەلیفە دەرحەق موهاجیرینی ئەووەلین کـە حەقیان بناسرێ ، حورمەتیان حیفظ بکرێ ، وەصیەتیان پێ‌ئەکەم دەرحەق ئەنصار بە خەیـر ئەو ئەنصارانەی کە لازمی مەدینەو ئیمان بوون لە پێش هیجرەتی پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ و ئەصحابی کیراما بۆ مەدینە کە ئیحســـانی ئەوانەیان کە ئەیکەن قەبووڵ بکەن‌و ، خەطای ئەوانە کـە خەطا ئـەکـەن

عەفوبکەن • هەم وەصیەتی پێ ئەکەم دەرحەق ئەهلی شـاران بـە خێر ؛ چونکی ئەوان موعاوینی ئیسلامن‌و جەمعی ماڵیان بۆ ئەکەن‌و بە قووەت‌و شەوکەتیان شەق بە کافران ئەبەن ، لـە ئەموالیان ئەوی لـە خۆیان زیـاد نەبێ‌و ، بە رەزای خۆیان نەبێ لێیان نەستێنرێ • هەم وەصیەتی پێ ئەکەم دەرحەق عەرەبی صەحرانشین بە خەیر ؛ چونکی ئەوان ئەصـڵی عەرەبن‌و ئەساسی ئیسلامن کە هەر لە ئەموالی خراپیان ماڵیان لێ‌بستێنن ، خیـاری ماڵیان لێ نەستێنن ، ئەویشی لێیان ئەستێنن بیدەنەوە بـە فەقیرەکانیـان • هەم وەصیەتیشی پێ ئەکەم دەرحەق ئەهلی ذیممەت بە ذیممەت‌و عەهـدی خواو رەسوولی خوا ئەو عەهدەی کە لەگەڵیانا کراوە هەڵی‌نەوەشـێنن ، بە تەواوەتی بەجێی‌بێنن ، ئەگەر دوشمنیان تەعەڕوزیان بکا مودافەعەیـان بکرێ‌و شەڕیان لەسەر بکرێ ، تەکلیفی ئەوەیان لێ نەکرێ کە لە تاقەتیانا نەبێ [ لە دوای سێ رۆژ وەفاتی کرد ]•

کـە وەفـاتی‌کردو تەجهیزو تەکفین کـرا بـردمانـە دەرێ‌و رۆیین ، عەبدوڵڵای کوڕی ـ رضي الله تعالى عنهما ـ سەلامی لە حەزرەتی عایشـــە ـ رضي الله تعـالى عنهـا ـ کردو عەرزی‌کرد : عومـــەری کوڕی خەطـاب ئیستیذان ئەکا ، فەرمووی : بیهێننە ژوورێ ، بردیانە ژوورێ‌و لەوێ لـە خزمەت رەفیقە عەزیزەکانیدا دفنیان‌کرد • کە لە دفنی بوونەوە ئەو شەش ذاتـە کۆبوونەوە ، عەبدوڕەحمان فەرمووی : ئەمری خۆتـان تەودیع بـە ســـیان بکەن • زوبەیر فەرمووی : ئەمری خۆم تەودیع بـە عەلی کـرد • طەلحە فەرمووی : ئەمری خۆم تەودیع بـە عوثمان کـرد • ســـــــەعد فەرمووی : ئەمری خۆم تەودیع بە عەبدوڕەحمان کرد [ یەعنی ســــیان تەبەڕڕییان کرد ، مانەوە سیان ] عەبدوڕەحمان فەرمووی : خوا وەکیـل‌و رەقیب بێ کێ لە ئێوە لەم ئیشە تەبەڕڕی بکا من ئـەم ئەمرەی تـەودیع

ئەکەم ، تێفکرێ لە ئیعتیقادیا کامیان لە لای ئەفضەلە بۆ ئەم ئیشە تەودیعی بەو بکاو خۆی وازی لێ بێنێ • یەعنی ئەگەر ئیمامی عەلی ئەزانێ کە عوثمان لەو ئەفضەلترە بۆی تەرك بکا ، عەلی وا بزانێ کە عوثمان لەو ئەفضەلە بۆی تەرك بکا[1] [ هەردوکیان لە ( نفس الأمر )ا فاضـیلن ، موبەششەرن بـە بەهەشت • کامیـان ئەفضەلە لـە ( نفس الأمـر )ا ؟ هەر خـوا ئەیزانێ • ئەفضەلی ظاهیری لـە عیلماو شـــەجاعەتا دیارە کـە کامیانە فەقەط •• ] هەردوکیان بێدەنگ بوون ، لە پاشا عەبدوڕەحمان فەرمووی : ئیشـــی خۆتان تەودیع بە من ئەکەن ، خوا ڕەقیب بێ لەسەر من کە قوصوور نەکەم لەوەدا کە ئەفضەلتان ئینتیخاب بکەم ؟ فەرموویان : بەڵێ تەودیع بە تۆ بێ • دەستی ئیمامی عەلی گرت فەرمووی : تۆ خزمایەتیت لـە خزمەت پێغەمەرا ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ و فەضلو سەبقەتت لە ئیسـلاما هەیە ، وەك خۆت ئەیزانی ، خـوا ڕەقیبی تۆ بێ ئـەگـەر بتکەم بـە خەلیفە عەدالـەت ئەکەی ، ئەگەر عوثمان بکەم بـە خەلیفە ئیطاعـەت ئەکـەی ؟ فەرمووی : بەڵێ • بە ئیمامی عوثمانیشـــــی وا فەرموو ئەویش وای جواب دایەوە [ سەعدی بنی وەقاص ئیشارەتی کردێ کە عوثمان بکا ] کە ئەم عەهدەی لە هەردوکیان وەرگرت بە ئیمامی عوثمانی فەرموو : دەســـت هەڵبڕە ، بەیعەتی پێکرد ، عەلیش بەیعەتی پێکرد ، خەڵقیش هاتنە ژوورێ بەیعەتیان پێکرد • تەمامی ( إن شاء الله ) لە ئیمامەتا بێت •

٢٩٢٩/٣٩ ـ عن المسور بن مَخْرَمة [ رضي الله تعالى عنهما ] قال : لما طعن عمر [ رضي الله تعالى عنه ] جعل يألم ، فقال له ابن عباس ـ رضي الله تعالى عنهما ـ فكأنه يُجَزِّعه [ يزيل جزعه ] : يا أمير المؤمنين ولئن كان

---

(١) ڕەنگە ئەمە هەڵە بێو ڕاستیەکەی ئاوایە : « عوثمان وابزانێ کە عەلی لەو ئەفضەلترە بۆی تەرك بکا » •

ذاك لقد صحبت رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فأحسنت صحبته ، ثم فارقته وهو عنك راض ، ثم صحبت أبا بكر فأحسنت صحبته ، ثم فارقته وهو عنك راض ، ثم صحبت صحبتهم فأحسنت صحبتهم ، ولئن فارقتهم لتفارقنهم وهم عنك راضون • قال : أما ما ذكرت من صحبةُ رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ ورضاه فإنما ذاك مَنٌّ من الله تعالى [ جل ذكره • نسخة ] منّ به علي • وأما ما ذكرت من صحبة أبي بكر ورضاه فإنما ذلك من منّ الله ـ جل ذكره ـ منّ به علي • وأما ما ترى من جزعي فهو من أجلك وأجل أصحابك [ أصيحابك • نسخة ] والله لو أن لي طلاع الأرض [ ملأها ] ذهباً لافتديت به من عذاب الله ـ عز وجل ـ قبل أن أراه • ح ـ ٦/١٠٠ [ وعند أبي حاتم من حديث ابن عباس ـ رضي الله تعالى عنهما ـ أنه دخل على عمر حين طعن ، فقال : أبشر يا أمير المؤمنين أسلمتَ مع رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ حين كفر الناس ، وقاتلت معه حين خذله الناس ، ولم يختلف في خلافتك رجلان، وقتلت شهيدا ، فقال : أعد ، فأعاد فقال : المغرور من غررتموه ، لو أن لي ما على ظهرها من بيضاء وصفراء لافتديت به من هول المطلع • قسطلاني ٦/١٠١ ] •

**تەرجەمە :**

میسوەری کوڕی مەخرومە ـ رضي الله تعالى عنهما ـ ئەفەرموێ : کە عومەر ـ رضي الله تعالى عنه ـ خەنجەرەکەیان لێدا تەئەللومی ئەکرد ئیبنوعەباس ـ رضي الله تعالى عنهما ـ بۆ دەفعی جەزەعەکەی عەرزی‌کرد : ئەی ئەمیرەلموئمینین ئەگەر ئەوە [ یەعنی وەفاتت ] واقیع بێ صوحبەتی پێغەمەرت کردوە ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ صوحبەتەکەیت زۆر باش بەجێ‌هێناوە ، لە پاشا لێی جوێ‌بوویتەوە کە لێت رازی بوە • لە دوای ئەو

صوحبەتی ئەبوبەکرت کردوە ـ رضي الله تعالى عنه ـ صوحبەتەکەیت جوانی بەجێهێناوە ، لە پاشا لێی جوێبوویتەوە کە لێت رازی بوە ، لـە پاشـــا صوحبەتی ئەصحابی ئەوانت کردوە ئەگەر لێیان جوێببیتەوە لە حاڵەتێکا لێیان جوێ ئەبیتەوە کە هەموو لیت رازی ئەبن • فەرمووی : ئەمما ئەوەی کە ئەڵێی صوحبەتی پێغەمەرم کردوەو لێم رازی بوە ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ ئەوە منەتێکە خوا ـ عز وجل ـ ناویـەتی بەسەرما • ئەوەی کـە ئەڵێی صوحبەتی ئەبوبەکر ـ رضي الله تعالى عنه ـ م کردوەو لێم رازی بوە ئەویش لەو منەتانەیە کە خوا ـ عز وجل ـ پێی ئینعام فەرمووم • ئەمما ئەو جەزەعەی کە ئەیبینی لە بەر تۆو ئەصحابی تۆیە [ یەعنی ئەترسم فیتنەتـان بەسەرا بێ لە دوای من ] وەڵلاهی ئەگەر پڕ بە ئەرز ئاڵتوونم بێ ئەیـدەم بە فیدیەی نەجات لە عەذابی خوا ـ عز وجل ـ لە پێش ئەمەدا کە بیبینم •

[ ئیبنوعەباس ـ رضي الله تعالى عنهما ـ کە عومەر ـ رضي الله تعـالى عنه ـ خەنجەرەکەی لێدرا چوە خزمەتی عەرزی‌کرد : موژدەبێ ( یا أمیـر المؤمنین ) لـە خزمەت پێغەمەرا ـ صلى الله تعالى عليـه وسـلم ـ قەبووڵی ئیسلامەتیت کرد لە وەختێکا کە خەڵق کافر بوون ، لە خزمەتیا موحارەبەت کـرد لـە وەختێکا کـە خـەڵق لێی تەکینەوە ، لـە خـەلافەتتا دوو کـەس ئیختیلافیان نەبوو ، شەهیدیش کرای • فەرمووی : ئیعـادەی بکەرەوە • ئیعادەی کردەوە • فەرمووی : مەغروور ئەو کەسەیە کە ئێوە مەغرووری بکەن • ئەگەر هەرچی زەردو سپیێ کە لەسەر ئەرزە بمبێ ئەیدەم بە فیدیەی رۆژی هەولی قیامەت • أبو حاتم • قسطلاني ] •

**شهادة عبدالله بن ملحان والد جابر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ(١) :**

٤٠/٢٩٣٠ ـ عن جابر ـ رضي الله تعالى عنه ـ قـال : لما حضر أحـد دعاني أبي من الليل فقال : ما أراني إلا مقتولا في أول من يقتل من أصحاب النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ وإني لا أترك بعدي أعز عليّ منك غير نفس رســـول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فإن علي ديناً فاقض ، واستوص بأخواتك [ التسع ] خيراً . فأصبحنا فكان أول قتيل ، ودفن معه آخر في قبر ، ثم لم تطب نفسي أن أتركه مع الآخر ، فاستخرجته بعد ستة أشهر ، فإذا هو كيوم وضعته هنية غير أذنه [ غير هنية في أذنـه . روايـة ابن السكن ] ح ـ ٢/٤٣٢ د ، ابن سعد ، طبراني ، حاكم .

**تەرجەمە :**

جابیر ـ رضي الله تعالى عنـه ـ ئەفەرموێ : کـە غەزای ئوحود بوو شەو باوکم بانگی‌کردم ، فەرمووی: وا ئەزانم کە من لە ناو ئەصحابی‌پێغەمەرا ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ ئەووەڵ کەسێکم کـە ئەکوژرێم ، لـە دوای نەفسی پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ لە تۆ عەزیزتر لە دوای خـۆم بەجێ نایێڵم ، قەرزم لەسەرە بۆم بدەرەوە [ تۆ خوشکت هەیە ] دەرحەق ئەو خوشکانەت وەصیەتی بەخەیرم قەبووڵ بکە . کە سبەینێ بۆوە ئەوەڵ کەسێ بوو کە شەهید کرا [ دفن‌کراو ] لەگەڵ ئـەوا یەکێکی تریش لـــە قەبرێکا دفن کـرا . دڵم پێی خۆش نـەبوو کـە لەگەڵ یەکێـکی تـرا بـە دفن‌کراوی تەرکی بکەم . لە دوای شەش مانگ دەرمهێنا ، غەیری نەختێ لە گوێی نەبێ وەك ئەو رۆژە بوو کە دامنابوو !

(١) شەهیدبوونی عەبدوللای کوڕی مەلحان کە باوکی جابیرە ـ خ ـ .

له ریوایەتی ئەبوداودا : چەند موویێ نەبێ لە ریشی لەو جێیەی کـە کەوتبوە سەر ئەرز هیچ جێیێکی زەرەری نەهێنابوو •

**زينب بنت رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ، ورضي عنها ـ :**

٢٩٣١/٤١ ـ عن محمد بن سيرين عن أم عطية ـ رضـــي الله تعـالى عنها ـ قالت : دخل علينا رســــول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ حين توفيت ابنته [ زوج أبي العاص ـ رضي الله تعالى عنهما ـ ] فقال : اغسلنها ثلاثاً ، أو خمساً ، أو أكثر من ذلك ، إن رأيتن ذلك بماء وسدر ، واجعلن في الآخرة كافورا أو شيئاً من كافور ، فـإذا فرغتنَّ فآذِنـّني ، فلما فرغنا آذناه ، فأعطانا حقوه فقال أشْعِرْنها إياه ، تعني إزاره [ أي ثوبها الذي يلي جسدها ] ح ـ ٣٦٨/٢ ، م ـ ٣٧٢/٤ •

وعن حفصة بنت سيرين بمثل حديث [ أخيه ] محمد وكان في حديث حفصة اغسلنها وترا ، وكان فيه ثلاثاً أو خمساً أو سبعاً ، وكان فيــه أنـه [ عليه الصلاة والســـلام ] قال : ابدأوا بميامينها وبمواضع الوضـــوء • وكان فيه أن أم عطية [ رضي الله تعالى عنها ] قالت : ومشطناها ثلاثة قرون ح ـ ٣٦٩/٢ •

وعن أم عطية ـ رضي الله تعالى عنها ـ قالت : ضفرنا شعر بنت النبي [ رسول الله ] ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ تعني ثلاثة قرون • قال سفيان : ناصيتها وقرنيها • وفي أخرى : وألقيناها خلفها • ح ـ ٣٧٢/٢ •

وعنها أنهن جعلن رأس بنت رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ ثلاثة قرون ، نقضنه ثم غســلنه ، ثم جعلنه ثلاثة قرون • ح ـ ٣٧١/٢ • وقال الحسن : الخرقة الخامسة يشَـدّ [ الغاسل ] بها الفخذين والوركين تحت الدرع • ح ـ ٣٧١/٢ •

ابن سيرين [ وكان أعلم التابعين بعلم الموتى ] يأمر بالمرأة أن تُشْعَر ولا تؤزر [ أي لا يجعل الشعار عليها مثل الإزار بأن لا يعم البـدن ] •
ح - ٢/٣٧٢ • م - ٤/٢٧٥ •

**تەرجەمە :**

ئیبنوسیرین [ رضي الله تعـالى عن أبيـه ويرحم إيـاه ] عن أم عطيـة ـ رضي الله تعالى عنها ـ ریوایەت ئەکا کە زەینەبی کچی پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ، ورضي عنها ـ وەفاتی کرد پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ تەشریفی هات فەرمووی : سێ دەفعە ، یـا پێنج دەفعە یـا زیاتـر لەوە ، ئەگەر لاتان وابوو کە زیاتری پێ ئەوێ ، بیشۆن بـە ئاوی مۆردو کافوور ، یا نەختێ کافوور بکەنە ئاوی ئاخریەوە ، کە لێبوونەوە خەبەرم بدەنێ • ئەفەرموێ : کــە لێبووینەوە خەبەرمان دایێ ئیزارەکەی خۆیی دایێ فەرمووی : بیکەن بـە شیعاری ، یەعنی لەســەر گۆشـتەوە پێی بپۆشن • لە ریوایەتی حەفصەی خوشکی ئیبنوسیرین لە عەطییەوە ـ رضي الله تعالى عنهما ورحمهما الله تعالى ـ بە میثلی ئەم ریوایەتە ریوایەت ئەکا •

لە ریوایەتی حەفصەدا ئەوەی لێزیادکردوە کە پێغەمەر ـ صـــلى الله تعالى عليه وسلم ـ فەرمووی : بە تاق بیشۆن سێ ، یا پێنج ، یـا حەوت ، دەست بکەن بە لای راستیو بە ئەعضای دەزنوێژی • عەطییە فەرمووی : پرچمان داهێناو کردمان بە سێ پرچ • سوفیانی ئیبنی عوەیەینە ئەفەرموێ : ناوچاوانی پرچێ ، ئەملاو ئەولای سەری دوو پرچ • عەطییە ـ رضـــي الله تعالى عنها ـ ئەفەرموێ : پرچمان کردەوە ، شتمان ، هۆنیمانەوە ، کردمـان بە سێ پرچ خستمانە پشت سەری • حەسەنی بەصری ـ رحمه الله تعـالى ـ ئەفەرموێ : لیباسی پێنجەم هەردوو رانیو هەردوو سمتی پێ ئەبەسترێ • ئیبنوسیرین ـ رحمه الله تعالى ورضي عن أبيه ـ ئەمری ئەکرد کە ژن هەموو

لیباســــــەکانی ئاوادامان تێوەپێچرێ نەکرێن بـە ئیزار کە هەموو بەدەنی دانەگرێ •

**وفاة ابنها ابن أبي العاص ـ رضي الله تعالى عنهما ـ والبكاء على الميت :**

٢٩٣٢/٤٢ ـ عن أبي عثمان = عن = أسامة بن زيد ـ رضي الله تعالى عنهما ـ قال : أرســلت ابنة النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ [ زينب ـ رضي الله تعالى عنها ـ ] إليه أن ابناً لي قبض [ أن صبياً لها ، أو ابناً لها في الموات • أخرى ] فأتنا ، فأرسل يقرىء السلام ويقول : إن لله ما أخذ ، وله ما أعطى، وكلٌ عنده بأجل مسمى، فلتصبر ولتحتسب•فأرسلت إليه تقسم عليه ليأتينَّها ، فقام ومعه سعد بن عبادة ، ومعاذ بن جبل ، وأبي بن كعب ، وزيد بن ثابت ، ورجال [ رضي الله تعالى عنهم ] فرفع إلى رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ الصبي ونَفَســه تَتَقَعْقَعُ [ تضطرب ] قـال : حسبته أنه قال كأنها شنٌ ، ففاضت عيناه • فقال سعد : يا رســـول الله ما هـذا ؟ [ تبكي وتنهى عن البكاء ؟ أخرى ] فقال : هـذه رحمة جعلها الله في قلـوب عبـاده ، وإنما يرحم الله من عبـاده الرحماء • ح ـ ٣٨٤/٢ ، م ـ ٢٥٦/٤ ، د ، ن ، جه •

**تەرجەمە :**

زەینەبی کچی پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ، ورضي الله تعالى عنها ـ ناردی بە شوێن پێغەمەرا ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ کە منالێکم ، یا فەرمووی : کوڕێکم لە حالی نەزعایە ، [ تەشریفی بێ ] پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ خەبەری بۆ ناردەوە کـە خوا ـ عز وجـل ـ ئەوەی

---

(١) مردنی کوڕی زەینەبی کچی پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ و ، گریان بۆ مردوو •

وەری ئەگرێو ئەوەی عەطای ئەفەرموێ هی ئەوە ، هەمووی ئەجەلێــکی موعەییەنی هەیە لای خوا ـ عز وجل ـ صەبر بکاو موتتەظیری ثەواب بێ • ناردیەوە خزمەتی سوێنی دا کە هەر ئەبێ تەشریفی بێت • تەشریفی هەڵسا ، سەعدی کوڕی عوبیادەو ، موعاذی کوڕی جەبـەلو ، ئوبەیی‌ی کـوڕی کەعبو ، زەیدی کوڕی ثابیتو چەند پیاوێکی تری لە خزمەتا چوو ـ رضي الله تعالى عنهم ـ کە تەشریفی چوە ئەوێ منالەکەیان نایـە باوەشی ، نەفەسی وەك مەشکالە تەقەتەقی بوو ، ئەهاتو ئەچوو ، چاوی پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فرمێسکی دارِشـــت • سـەعد ـ رضي الله تعالى عنه ـ عەرزی‌کرد : ( یا رسول الله ) ئەمە چیە ؟ تۆ نەهی ئێمە ئەکەی لـە گریانو کەچی خۆت ئەگریت ! فەرمووی : ئەم گریانە رحمەتێکە خوا خستویەتیە دڵی عیبادیەوە • خوا ـ عز وجل ـ ئەمجا هەر بە صاحێب مەرحەمەتان رەحم ئـەکـا •

گریان بەو شەرتە بە دەنگی بەرزەوە نەبێ دروستە •

**وەفاتی ئوممو‌کولثووم ـ رضي الله تعالى عنها ـ زوجة عثمان ـ رضي الله تعالى عنه ـ :**

٢٩٣٣/٤٣ ـ عن أنس بن مالك ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال : شهدنا بنتاً لرسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ قال : ورسول الله ـ صلى الله تعـالى عليــه وسلم ـ جالس على القبر قال : فرأيت عينيه تدمعان • قال : فقال : هل منكم رجل لم يقارف الليلة ؟ فقال أبو طلحة ـ رضي الله تعـالى عنه ـ : أنا • قال : فانزل • قال : فنزل في قبرها [ وللبخاري في التـأريـخ الأوسط عن أنس ـ رضي الله تعالى عنه : لا يدخل القبر أحد قارف الليلة • فتنحى عثمان ـ رضي الله تعالى عنه ـ ] • ح ـ ٣٨٤/٢ •

**تەرجەمە :**

ئەنەس ـ رضـي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : حـازری جـەنـازەی ئومسوكولثوومی كچی پێغەمەر بووین ـ صلى الله تعـالى عليـه وسـلم ـ پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ تەشریفی لەسەر كەناری قەبرەكەی دانیشتبو . چاوی موبارەكی فرمێسكی لێ ئەهات ، فەرمووی : كەسێكتان نییە كە ئیشەو لەگەڵ ژنـا موجامەعەی نەكردبێ ؟ ئەبوطەلحە ـ رضي الله تعالى عنه ـ عەرزی كرد : من • فەرمووی : بچۆرە خوارەوە ناو قەبرەكە • چوە خوارەوە ناوی [ ئیمامی عوثمان ـ رضي الله تعالى عنه ـ چونكی لـەو وەختەدا كە كچی پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ لە لای گیانی ئەدا خەریكی كەیف بوو لەگەڵ ژنانا كەوتە لاوە ] •

**إبراهيم ابنه ـ عليهما الصلاة والسلام ـ(١) :**

٢٩٣٤/٤٤ ـ عن أنس [ بن مالك ـ رضي الله تعالى عنه ـ ] قال : قال رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ : ولد لي الليلة غلام فسميته باسم أبي إبراهيم ـ عليه السلام ـ ثم دفعه الى أم سيف : امرأة قين يقـال لـه : أبو سيف ، فانطلق يأتيه ، واتبعته فانتهينا الى أبي سيف وهو ينفخ بكيره ، قد امتلأ البيت دخاناً ، فأسرعت المشي بين يدي رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فقلت : يا أبا سيف أمسك جاء رسول الله ـ صلى الله تعـالى عليه وسلم ـ فأمسك ، فدعا النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ بالصـبي فضمه إليه ، وقال ما شاء الله أن يقول • فقال أنس : لقد رأيته وهو يكيـد بنفسه [ أي يجود ] بين يدي رســـول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فدمعت عينا رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فقال : تدمع العين ،

---

(١) ئیبراهیمی كوڕی پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ •

ويحزن القلب ، ولا نقول إلا ما يرضي ربنا والله يا إبراهيم إنا [ بفراقك • بخاري ] بك لمحزونون • م – ٩/١٨١ ، ح – ٢/٣٩٨ وفيه : عينا رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ تذرفان ، فقال له عبدالرحمن بن عوف ـ رضي الله تعالى عنه ـ : وأنت يا رسـول الله ؟ فقال : يـا ابن عوف إنهـا رحمة ••• إلخ ح – ٢/٣٩٨ •

**تەرجەمە :**

ئەنەس ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : پێغەمەر ـ صلى الله تعـالى عليه وسلم ـ فەرمووی : ئیمشەو کوڕێکم بوە بە ناوی ئیبراهیمی باوکمەوە ـ عليـه السـلام ـ ناوم ناوە • ئەسـلیمی ئومموسەیفی ژنی ئەبوسـەیفی ئاسنگەری کرد • پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ تەشریفی چوو بۆ لای منیش لە خزمەتیا چووم ، کە گەیینە لای ماڵی ئەبوسەیف ـ ئەبوسەیف بە مووشەدەمە کوورەی جۆش ئەدا ، ماڵەکـەی پڕ بووبوو لە دووکـەڵ ، هەی‌پێم لێ کرد لە پێش پێغەمەرەوە ـ صلى الله تعالى عليـه وسلم ـ چووم پێم‌وت : ئەی ئەبوسەیف بوەستە پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسـلم ـ تەشریفی هات ، وەستا پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ منالـەکـەی طەڵەب‌کرد ، بەخۆیەوە گوشی ، ئەوی خوا حەزەکا فەرمووی ، لـە دوای ئەوە چووینەوە لای ، ئیبراهیم گیانی ئەدا ، چاوی پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فرمێسکی ئەڕژان ، عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف ـ رضي الله تعالى عنـه ـ عەرزی‌کـرد : تۆیش ( یـا رسـول الله ) ؟ فەرمووی : ئەی ئیبنوعەوف ئەمە ڕەحمەتە • لە پاشا فەرمووی : چـاو فرمێسـك ئەکا ، دڵ مەحزوون ئەبێ ، غەیری ئەوەی کـە خـوا ڕەزای لێ‌بێ هیچی تر ناڵێین • وەڵڵاهی یا ئیبراهیم ئێمە بە لێ‌جوێ‌بوونەوەی تۆ لێمان مەحزوونین •

٢٩٣٥/٤٥ ـ بـراء ـ رضي الله تعـالى عنـه ـ قال : لما توفي إبراهيم ـ عليه السلام ـ قال رسول الله ـ صلى الله تعـالى عليـه وسلم ـ : إن لـه مرضعاً في الجنة • ح ـ ٢/٤٦٠ وفي مسلم : إنه مات في الثدي ، وإن لـه لظئرين يكملان رضاعه في الجنة • م ـ ٩/١٨١

**تەرجەمە :**

كە ئیبراهیم ـ علیه السلام ـ وەفاتیكرد پێغەمەر ـ صـلى الله تعـالى علیه وسلم ـ فەرمووی : دایەتێكی لە بەهەشتا هەیە ، لە ریوایەتی موسلیما دوو دایەنی هەیە موددەی شیری بۆ تەواو ئەكەن لە بەهەشتا •

[ لە موسنەدی فەریابیدایە : پێغەمەر ـ صلى الله تعـالى علیه وسلم ـ تەشریفی چوە لای حەزرەتی خەدیجە ـ رضي الله تعالى عنها ـ دوای وەفاتی قاسمی كوڕی پێغەمەر ـ صلى الله تعالى علیه وسلم ـ عەرزی پێغەمەریكرد ـ صلى الله تعالى علیه وسلم ـ و ئەگریا : ( یا رسول الله ) شـــیری قاسـم ئەبزویو زۆر بوە ، ئەگەر بژیایە تا لە شیرم ئەبڕیەوە لەسەرم ئاســـــان ئەبوو • پێغەمەر ـ صلى الله تعالى علیه وسلم ـ فەرمووی : لـە بەهشـــتا دایەنی هەیە موددەی شیردانی تەواو ئەكا • فەرمووی : ئەگەر بزانم وایـە حوزنم ئەهوەن ئەبێ • پێغەمەر ـ صلى الله تعالى علیه وسلم ـ فەرمووی : ئەگەر هەوەست یێنی دەنگی قاسمت بخەمە گوێوە • عەرزیكرد : خەیـر بڕوام بە خواو پێغەمەری هەیە ، قەسطەلانی ] •

كاشكی بیویستایە ! فەقەط ئیمانو عەقڵی ئەوەند كامڵ بـوە حـەزی نەكردوە كـە لـە زومرەی ( مؤمنین بالغیب ) بچێتـە دەرێو لـەو ئەجـرە مەحرووم بێ •

**گریانو لاواندنەوە :**

٢٩٣٦/٤٦ ـ عمرة بنت عبدالرحمن بن زرارة ـ رحمها الله ـ قالت : سمعت عائشة ـ رضي الله تعالى عنها ـ قالت : لما جاء النبيَّ ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ قتلُ ابن حارثة ، وجعفر ، وابن رواحة جلس يعرف فيه الحزن وأنا أنظر من صائر الباب ، شق الباب ، فأتاه رجل فقال : ان نساء جعفر . وذكر بكاءهن ، فأمره أن ينهاهن ، فذهب ثم أتاه الثانية لم يطعنه . فقال : انهض . فأتاه الثالثة . قال : والله غلبننا يا رسول الله . فزعمت أنه قال فاحثُ في أفواههن التراب . فقلت : أرغم الله أنفك ! لم تفعل ما أمرك رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ ولم تترك رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ من العناء ! ح ـ ٣٩٣/٢ ، ٤٠٠ ، م ـ ٢٦٨/٤ ، د ، ن وأخرجه في المغازي في غزوة مؤتة .

**تەرجەمە :**

عايشە ـ رضي الله تعالى عنها ـ ئەفەرموێ : کە خەبەری شەهادەتی جەعفەرو ، زەیدی بنی حاریثەو ، ئیبنورەواحە ـ رضي الله تعالى عنهم ـ هات بۆ پێغەمبەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ پێغەمبەر ـ صلى الله تعالى وسلم ـ تەشریفی بە مەحزوونی دانیشتبوو ، منیش لە درزی دەرگاکەوە تەماشام ئەکرد ، پیاوێ هاتە خزمەتی عەرزیکرد : ژنانی جەعفەر [ ئەسمای ژنیو ئەو ژنانەی کە لە لای بوون ] بەحتی لە گریانیان ئەکرد ، ئەمری پێ فەرموو بچێ نەهیان لێ بکا نەگرین ، چوو هاتەوە عەرزیکرد : ئیطاعەم ناکەن ، فەرمووی : دووبارەو تا سێ دفعە هیچ گوێیان نەدایێ . دەفعەی سێیەم کە هاتەوە پێیفەرموو : خۆڵ بکەرە دەمیانەوە . عایشە ـ رضي الله تعالى عنها ـ ئەفەرموێ :

پێم‌وت : خوا لووتت له ئه‌رز نێ ! ئه‌وی پێغه‌مه‌ر ـ صـلى الله تعـالى عليـه وسلم ـ ئه‌مری پێ‌فه‌رمووی نه‌تكردو پێغه‌مه‌ریشت ـ صلى الله تعالى عليـه وسلم ـ نارِه‌حه‌ت‌كرد ! [ يه‌عنی كه پێت نه‌ئه‌كرا بتوتایه : پێم‌ناكرێ یـه‌كێ بنێره كه ده‌ره‌قه‌تیان بێ‌و به گوێی بكه‌ن • نه‌وه‌وی ] •

٢٩٣٧/٤٧ ـ عن أم عطية [ رضي الله تعالى عنها ] قالت : لما نزلت هذه الآية ( يبايعنك = على = أن لا يشركن بالله شيئاً ولا يسرقن ، ولا يزنين ، ولا يقتلن أولادهن ، ولا يأتين ببهتـان يفترينه بين أيديهن وارجلهن ، ولا يعصـــــينك في معــــروف )[1] قـالت : كـان منـه النيـاحـــة • قـالت : فقلت : يـا رســـــــول الله إلا آل فـلان فـإنهم كـانـوا أســـــعدوني في الجاهليـة فـلا بـد لي = من = أن أســـــعدهم • فقال رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ : إلا آل فلان • م ـ ٣٧١/٤، ح ـ ٣٠٦/٧ بالمعنى • ونقل القسطلاني هنا أحاديث تدل على أن الرخصة لا خصوصية لها بأم عطية ـ رضي الله تعالى عنها ـ فراجع •

**ته‌رجه‌مه :**

ئوممو‌عه‌طییه ـ رضـي الله تعـالى عنهـــا ـ ئه‌فه‌رموێ : كـه ئایـه‌تی ( يبايعنك = على = أن لا يشـــركن بالله ••• ) الآية = هاته‌خواره‌وه = یه‌عنی ژنان كه هاتنه لات موبایه‌عه‌ت له‌گه‌ڵ بكه‌ن موبایه‌عه‌یان له‌گه‌ڵ بكه له‌سه‌ر ئه‌مه كه شه‌ریك بۆ خوا نه‌گرن ، له مه‌عرووفا موخاله‌فه‌ی تۆ نه‌كه‌ن• ئه‌فه‌رموێ : نه‌هی له لاوانه‌وه له‌و مه‌عرووفه‌یه كه نه‌هی لـه موخاله‌فـه‌ی كراوه • ئه‌فه‌رموێ : عه‌رزم‌كرد : كه ئالی فلاّن نه‌بێ ؛ چونكی لـه زه‌مانی جاهیلییه‌تا ئه‌وان موعاوه‌نه‌تی منیان‌كرد له لاوانه‌وه‌دا لازمه له‌ســه‌رم كـه

(١) الممتحنة / ١٢ •

منیش موساعەدەیان بکەم لەگەڵیانا بلاوێنمەوە • پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فەرمووی : ئیللا ئالی فلان نەبێ •

لاوانـەوە بـە دەنگی بـەرزو باوکەڕۆو براڕۆ حەرامە ، تەنهـا بـۆ ئوممومعەطییەو ئەویش هەر بۆ ئالی فلان روخصەت دراوە[1] ، بۆ غەیـری ئەوو ئەویش بۆ غەیری ئالی فلان دروست نیە • نەوەوی •

٢٩٣٨/٤٨ ـ وعنها قالت : أخذ علينا النبي ـ صـــلى الله تعالى عليه وسلم ـ عند البيعة أن لا ننوح ، فما وفت منا امرأة غير خمس نســـوة : أم سليم ، وأم العلاء ، وابنة أبي سبرة امرأة معاذ ، وامرأتين ، أو ابنة أبي سبرة وامرأة معاذ ، وامرأة أخرى • ح ـ ٢/٤٠٠ ، م ـ ٤/٢٧٠ ، ن •

**تەرجەمە :**

ئوممومعەطییە ـ رضي الله تعالى عنها ـ ئەفەرموێ : پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ لـە وەختی موبایەعـەدا عەهدی لێ وەرگرتین کـە نەلاوێنینەوە • لەو ژنانەی کە موبایەعەیان لە خزمەتا کرد غەیری پێنج ژن : ئوممومســـولەیمو ، ئوممولعەلاو ، کچی ئەبوسەبرەی ژنی مەعاذو ، دوو ژنی تر ، یا فەرمووی : کچی ئەبوســـەبرەو ژنی مەعاذو دوو ژنی تر •• غەیری ئەمانە هیچیان وەفایان بە عەهدەکەیان نەکرد •

٢٩٣٩/٤٩ ـ عن أنس بن مالك ـ رضي الله تعـالى عنـه ـ قال : مرَّ النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ بامرأة تبكي عند قبر ، فقال : اتقي الله واصبري • قالت : إليك عني [ وما تبالي بمصيبتي م ] فإنك لم تصـــب

(١) دانەر ـ خ ـ لە پاڵ حەدیثەکەدا نووسیویە کە قەسطەلانی لەو شوێنەدا چەند حەدیثی نەقڵ کردوە کە دەلالەت لەســـــەر ئەوە ئەکەن کـە روخصەتەکە تەنها بۆ ئوممومعەطییە نیە •

بمصيبتي ، ولم تعرفه • فقيل لها : إنه النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ [ القائل هو الفضل بن عباس ـ رضي الله تعالى عنهما ـ طبراني ] ، [ فأخذها مثل الموت • م ] فأتت باب النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فلم تجد عنده بوابين ، فقالت : لم أعرفك ، فقال : إنما الصبر عند الصدمة الأولى • ح ـ ٢/٣٨٢ ، م ـ ٤/٢٥٩ ، أخرجه في الأحكام أيضاً ، د ، ت ، ن

**تەرجەمە :**

ئەنەس ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ تەشريفى بە لاى ژنێكا رابورد لەسەر قەبرێ ئەگريا • پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فەرمووى : تەقوات لە خوا بىێ‌و صەبر بكە ، وتى : لێم دوورموەكەوە ، تۆ بە موصيبەتى من گرفتار نەبووى موبالاتى پێ ناكەى • ئەو ژنە نەيزانى كە ئەوە پێغەمەرە ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فەضلى كوڕى عەباس ـ رضي الله تعالى عنهما ـ پێى‌وت : ئەوە پێغەمەرە ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ [ ژنەكە زۆرى پێ‌ناخۆش بو لە مردنەوە نزيك بوو ] لێى‌دا چوە بەردەرگاى ماڵى پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ لە بەردەرگاكەيا دەركەوانى نەدى • عەرزى‌كرد : نەمناسيت ، يەعنى قوصوورم عەفو بكە كە بە ناشيرينى جوابم دايەوە • پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فەرمووى : صەبر ئەمجا لە = ئەووەڵ = وەختى تووشبوونى موصيبەتا فائيدە بەخشەو ثەوابى كاميلى هەيە ، يەعنى چونكى لە ئەووەڵەوە صەبرت نەكرد ئێستە لە ئەجرى كاميلى مەحرووم بووى •

٥٠/٢٩٤٠ ـ عن عبدالله بن عبيدالله بن أبي مليكة قال : توفيت ابنة لعثمان [ أم أبان • ] ـ رضي الله تعالى عنه ـ بمكة وجئنا لنشهدها ، وحضرها ابن عمر وابن عباس ـ رضي الله تعالى عنهم ـ وإني لجالس بينهما

أو قال : جلست الى أحدهما • ثم جاء الآخر فجلس إلى جنبي فقال عبدالله بن عمر – رضي الله تعالى عنهما ـ لعمرو بن عثمان : ألا تنهى عن البكاء ؟ فإن رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ قال : إن الميت ليعذب ببكاء أهله عليه • فقال ابن عباس – رضي الله تعالى عنهما ـ : قد كان عمر ـ رضي الله تعالى عنه ـ يقول بعض ذلك •

ثم حدّث فقال : صدرت مع عمر ـ رضي الله تعالى عنه ـ من مكة حتى إذا كنا بالبيداء اذا هو بركب تحت ظل ثمرة ، فقال : اذهب فانظر من هؤلاء الركب ؟ قال : فنظرت فإذا صهيب ، فأخبرته فقال : ادعه لي [ فليلحق بنا ، فقلت : إن معه أهله • قال : وان كان معه أهله • م ] فرجعت الى صهيب فقلت : ارتحل فالحق بأمير المؤمنين ، فلما أصيب عمر [ رضي الله تعالى عنه ] دخل صهيب يبكي يقول : وا أخاه ! وا صاحباه ! فقال عمر ـ رضي الله تعالى عنه ـ : يا صهيب أتبكي عليّ وقد قال رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ ان الميت يعذب ببعض بكاء أهله عليه ؟ قال ابن عباس ـ رضي الله تعالى عنهما ـ : فلما مات عمر [ رضي الله تعالى عنه ] ذكرت ذلك لعائشة ـ رضي الله تعالى عنها ـ فقالت : يرحم الله عمر ، والله ما حدث رسول الله إن الله ليعذّب المؤمن ببكاء أهله عليه ، لكن رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ قال : إن الله ليزيد الكافر عذاباً ببكاء أهله عليه • وقالت: حسبكم القرآن : ( ألاّ تزر وازرة أخرى )[1] قال ابن عباس ـ رضي الله تعالى عنهما ـ عند ذلك والله = هو = أضحك وأبكى • قال ابن أبي مليكة : والله ما قال ابن عمر [ رضي الله تعالى عنهما ] ـ شيئا • خ ـ ٣٨٦/٢ ، م ـ ٢٦٤/٤ •

---

(١) النجم / ٣٨ •

الحديثان صحيحان ولا منافاة بينهما بحمل التعذيب على الوصية بالبكاء وعدمه على عدمها • من قسطلاني •

**تەرجەمە :**

عەبدوڵڵای کوڕی عوبەیدوڵڵای کوڕی ئەبو موولەیکە ـ رحمه الله ـ ئەفەرموێ : ئومموئەبانی کچی ئیمامی عوثمان رضي الله عنه ـ لە مەککەدا وەفاتی کرد ، چووین کە حازری جەنازەکەی بین • ئیبنوعومەرو ئیبنوعەباس ـ رضي الله تعالى عنهما ـیش حازری بوون ، من لە بەینیانا دانیشتبووم ، یا فەرمووی من لە تەنیشت ئیبنوعومەرەوە ـ رضي الله تعالى عنهما ـ دانیشتبووم ، یەکێکیش دەستی ئیبنوعەباس ـ رضي الله تعالى عنهما ـی رائەکێشا هێنای و لە تەنیشت منەوە دانیشت [ من کەوتمە بەینیان دەنگی گریان لەماڵەوە هات • م ] ئیبنوعومەر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ بە عەمری کوڕی عوثمان ـ رضي الله تعالى عنه ـ ی فەرموو : بۆ مەنعیان لە گریان ناکەی ؟ پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فەرمووی : مردوو بە گریانی کەس‌وکاری لە سەری موعەذذەب ئەبێ • ئیبنوعەباس ـ رضي الله تعالى عنهما ـ فەرمووی : عومەر ـ رضي الله تعالى عنه ـ بەعزێ لەوەی ئەفەرموو •

لە پاشا فەرمووی : لە خزمەتیا لە مەککەوە ئەگەڕامەوە تا گەیینە بەیداء تێفکرین چەند سوارێ لە ژێر سێبەری دار سەمورەیێکا بوون ، ئەمری پێ‌فەرمووم : بچۆ بزانە ئەوانە کێن • چووم تێفکریم صوهەیب بوو ـ رضي الله تعالى عنه ـ خەبەرم دایێ ، فەرمووی : بۆم بانگ بکە [ عەرزم‌کرد : ماڵو منالی لەگەڵە ، فەرمووی : با ماڵو منالیشی لەگەڵ بێ • م ] گەڕامەوە بۆ لای صوهەیب پێم‌وت : هەڵسە بکەرە ئەمیرولموئمینین [ هاتە خزمەتی تا گەیینە مەدینە ] کە ئیمامی عومەر ـ رضي

الله تعـالى عنــه ـ خەنجەرەکەی لێـدرا صوهەیب هاتـە عەیادەتی ئەگریاو ئەیوت : ئای بۆ براکەم ! ئای بۆ رەفیقەکەم ! عومەر ـ رضي الله تعالى عنه ـ فەرمووی : ئەی صوهەیب بۆ تۆ لەسەر من ئەگریت ؟ [ فەرمووی : بەڵێ وەڵڵاهی لەســەر تۆ ئەگریم • م عن أبي موسى ـ رضـي الله تعـالى عنــه ـ ٤ ـ ٢٦٤ ][1] فەرمووی : پێغـەمـەر ـ صلى الله تعـالى عليـه وســلم ـ فەرموویەتی : مردوو بـە بەعزێ گریانی کەس‌وکاری لەسەری موعەذەب ئەبێ • ئیبنوعەباس ـ رضي الله تعالى عنهما ـ فەرمووی : کە عومەر ـ رضي الله تعالى عنه ـ وەفاتی‌کرد ئەوەم عەرزی عایشە ـ رضي الله تعالى‌عنها ـکرد ، فەرمووی : عومەر رەحمەتی خوای لێبێ ، وەڵڵاهی پێغەمەر ـ صـلى الله تعالى عليه وسلم ـ نەیفەرموە کە مەیتی موسوڵمان بە گریانی کەس‌و کاری لە سەری عەذاب ئەدرێ ، ئەمما ئەوەی فەرموو کـە خوا ـ عـز وجـل ـ عەذابی کافر زیاد ئەکا بە گریانی کەس‌و کاری لەســـــەری • فەرمووی : قورئان کافیە بۆ ئێوە کە ئەفەرموێ : هیچ نەفسـێکی گوناهبار گونـاهی کەسێکی تر هەڵناگرێ ، یەعنی بە گوناهی ئەو گوناهبار نابێ • ئیبنوعەباس ـ رضي الله تعالى عنهما ـ ئەم ئایەتەی خوێندەوە کـە مەئـالی وایە : خـوا ئینسـان یێنێتە پێکەنین‌و ئەیگرینێ ، یەعنی گریـان‌و پێکەنین‌و حـوزن‌و سورور لە خواوەیە ، تەئثیر ناکەن لە عەذابی‌کەسێکی ترا ئیبنوئەبی‌مولەیکە فەرمووی : وەڵڵاهی ئیبنوعومەر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ هیچی نەفەرموو [ ئەمما لازم ناکا لەبەر عەجزی بێ لە جواب ، بەڵکو حەزی لە موجادەلـە نەکردوە ] •

٢٩٤١/٥١ ـ عن أنس ـ رضي الله تعالى عنــه ـ أن عمر بن الخطاب لما طعن عولت عليه حفصة [ رضي الله تعالى عنها ] • فقال : يا حفصة أمـا

---

(١) دانەر ـ خ ـ لێرەدا تەرجەمەی چەند قســــەیێکی کردوە ، کـــە عەرەبییەکەیانی نەنووسیوە •

سمعتِ رســــول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ يقول : المعوَّل عليه يعذَّب ؟ وعول عليه صهيب فقال عمر : يا صهيب أما علمت أن المعول عليه يعذب ؟ م ـ ٤/٢٦٣ ٠

**تەرجەمە :**

ئەنەس ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : كە ئیمامی عومەر ـ رضي الله تعالى عنه ـ خەنجەری لێدرا حەفصە ـ رضي الله تعالى عنها ـ بە هاوارەوە بۆی گریا ٠ = عومەر = فەرمووی : ئەی حەفصە بۆ نەتبیســــتوە لـە پێغەمەر ـ صلى الله تعالى علیـه وسـلم ـ فەرموویەتی ئەوەی واوەیلای بۆ بکرێ عەذاب ئەدرێ ؟ صوهەیبیش ـ رضي الله تعالى عنه ـ بـە واوەیلاوە بۆی گریا ، پێیفەرموو : ئەی صـوهەیب بۆ نازانی ئەوی کـە واوەیلای لەسەر بکرێ عەذاب ئەدرێ ؟

٢٩٤٢/٥٢ ـ عن عروة قال : ذكر عند عائشة أن ابن عمر [ رضي الله تعالى عنهم ] يرفع الى النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ أن الميت يعـذب في قبره ببكاء أهله ، فقالت : وَهِلَ [ غلط ] إنما قال رسـول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ : إنه يعذب بخطيئته أو بذنبه وإن أهله ليبكون عليه الآن ٠ وذلك مثل قوله : إن رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ قـام على القليب يوم بدر وفيه قتلى بدر من المشـــركين فقال لهم ما قال : إنهم ليسمعون ما أقول ، وقد وهل ، إنما قال : إنهم ليعلمون أن ما كنت أقـول لهم حق ٠ ثم قرأتْ ( إنك لا تسمع الموتى )[1] ( وما أنت بمسـمع من في القبور )[2] يقول حين تبوؤا مقاعدهم من النار م ـ ٤/٢٦٤ ٠

---

(١) النحـل / ٨٠ ٠

(٢) فاطـر / ٢٢ ٠

٢٩٤٣/٥٣ ـ وعن عروة قال ذكر عند عائشة [ رضي الله تعالى عنها ] قول ابن عمر [ رضي الله تعالى عنهما ] الميت يعذب ببكاء أهله عليه فقالت : يرحم الله أبا عبدالرحمن سمع شيئاً فلم يحفظ ، إنما مرت على رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ جنازة يهودي وهم يبكون عليه ، فقال : أنتم تبكون وإنه ليعذب ٠ م ـ ٤/٢٦٦ ( بەسە ) ٠

**تەرجەمە :**

که بە حەزرەتی عایشە گەیی کە ئیبنوعومەر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ بە مەرفووعی ئەفەرموێ : کـە پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليـه وسلم ـ فەرموویەتی : کـە مردوو بـە گریـانی کەس و کاری لەسەری موعەذذەب ئەبێ ٠٠ فەرمووی : بە غەلەطا چوە ٠ پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فەرمووی : مردوو بە گوناهی خۆی لە قەبرا عەذاب ئەدرێ کەچی کەس و کاری ئێستەکە لەسەری ئەگرین ٠ وەك پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليـه وسلم ـ لەســـــەر چاڵەقوتەی بـەدر تەشریفی وەستاو ئەوی فەرمووی ، فەرمووی ٠ لە پاشا لـە جوابی عومـەرا ـ رضـي الله تعـالى عنـه ـ کـە فەرمووی : تۆ چۆن قسە لەگەڵ ئەو لاشە بێ رۆحانە ئەکەی ؟ فەرمووی : ئەوان گوێیان لەوەیە کە من ئەیڵێم ٠ لەوەیشا عومەر ـ رضي الله تعالى عنه ـ بەغەلەط چوو ؛ پێغەمەر ـ صلى الله تعـالى عليه وسلم ـ فەرمووی : ئێستە کە جێگیر بوون لە ئاگرا ئەزانن کە ئەوی من پێم وتوون حەقە ، ئێســـتە تێگەییون ٠ لە پاشا عایشە ـ رضي الله تعالى عنها ـ ئەم ئایەتەی خوێندەوە کە مەئالی وایە : ئەی محمد تۆ قسە بە مردوو نابیەی ٠ ئەوی لە قەبریشایە قسەی پێ نابیەی ٠

لە ریواتەکەی ترا خوا رەحم بە ئەبوعەبدورەحمان بکا ، شــــتێکی بیســـتوەو تێی نەگەییوە ؛ بەلای پێغەمەردا ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ

جەنازەیەکی جوولەکە رابورد ، لەســــەری ئەگریـان ، فەرمووی : ئێوە لەسەری ئەگرینو ئەو عەذاب ئەدرێ •

ئـەم حەدیثانە هەموو صـــــەحیحن ، کـە ئەمر بەگریان بکا بۆی موعەذذەب ئەبێ ، ( وإلا ) موعەذذەب نابێ •

**الميت لا ينجس(١) :**

ئیبنوعومەر ـ رضي الله تعالى عنـه ـ حەنووطی کـــرد بـە کوڕێکی سەعیدی کوڕی زەیدەوە ـ رضي الله تعـالى عنــه ـ و هەڵی‌گرتو نوێژی لەسەر کرد ، دەستنوێژی نەشتەوە •

ئیبنوعەباس ـ رضي الله تعالى عنهما ـ ئەفەرموێ : موسوڵمان نە بـە زیندوویی نە بە مردوویی پیس نابێ • سەعدی کوڕی وەقاص ـ رضي الله تعالى عنهما ـ ئەفەرموێ : ئەگەر مردوو پیس ببوایە دەســــتم لێ نەئەدا • پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فەرمووی : موسوڵمان پیس نابێ • عەطاو زوهـریو عەمـری کوڕی دینارو قەتـادە ئەفەرموون : کفـن لــە ( رأس المال ) ئەدرێ • ح ـ ٢/٣٦٨ •

عەمری کوڕی دینار ئەفەرموێ : حەنووط لە هەمووماڵەکە دەرەکرێ • ئیبراهیمی نەخەعی ئەڵێ : لە پێشا کفن ، لە پاش ئەو قەرز ، لە پاش ئـەو وەصیەت • سوفیان ئەفەرموێ : ئوجرەی قەبرو ئوجرەی شـــتن داخڵی کفنە • ح ـ ٢/٣٧٧ •

٢٩٤٤/٥٤ ـ عن إبراهيم أن أبـاه عبدالرحمن بن عوف ـ رضـي الله تعالى عنه ـ أتي بطعام وكان صائماً ، فقال : قتل مصعب بن عمير وهو خير

---

(١) مردوو پیس نابێ •

مني كفن في بردة إن غطي رأسه بدت رجلاه ، وإن غطي رجلاه بدا رأسه • وأراه قال : وقتل حمزة وهو خير مني ، ثم بسط لنا من الدنيا ما بسط • أو قال : أعطينا من الدنيا ما أعطينا ، وقد خشينا أن تكون حسناتنا عجلت لنا ، ثم جعل يبكي حتى ترك الطعام • ح - ٣٧٨/٢ ، ٣٧٧ • ح - ٢٨٦/٦

**تەرجەمە :**

ئیبراهیمی کوڕی عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : باوکی بەڕۆژو بوو لە ئیفطارا طەعامیان بۆ هێنا ، فەرمووی : موصعەبی کوڕی عومەیر لە ئوحودا شەهید بوو ، ئەو لە من چاتر بوو لە بوردەیێکا کفن کرا سەری پێی داپۆشرایە پێی دەرەکەوت ، پێی داپۆشرایە سەری دەرەکەوت • وا بزانم فەرموویشی : حەزرەتی حەمزە شەهید کرا ئەو لە من چاتر بوو ، یەعنی ئەویش وا کفن کرا ، لە پاشا دنیا بۆ ئێمە واسیع کرا ، یا فەرمووی : لە دنیا ئەوی پێمان عەطا کرا ـ کرا • ئەترسین ئەم دنیایە کە دراومانەتێ ثەوابی عەمەلمان بێ بۆمان هێنراییتە دنیاوە • لە پاشا گریاو طەعامەکەی نەخوارد •

٢٩٤٥/٥٥ ـ أبو مالك الأشعري [ رضي الله تعالى عنه ] حدث أن النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ قال : أربع في أمتي من أمر الجاهلية لا يتركونهن : الفخر في الأحساب ، والطعن في الأنساب ، والاستسقاء بالنجوم ، والنياحة ، وقال : النائحة اذا لم تتب قبل موتها تقام يوم القيامة وعليها سربال من قطِران ودرع من جرَب • م - ٢٦٨/٤ •

**تەرجەمە :**

پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فەرمووی : چوارشت = لە ئوممەتی مندا = لە کردەوەی جاهیلییەتە تەرکی ناکەن : فەخرکردن

به حه‌سه‌ب ، طه‌عندان له نه‌سه‌ب ، طه‌ڵه‌بی باران به واسیطه‌ی ئه‌ستێره‌وه • لاوانه‌وه • فه‌رمووی : ئه‌و ژنه‌ی ئه‌لاوێنێته‌وه ئه‌گـه‌ر لـه پێش مردنیـا ته‌وبه‌ی لیٚ نه‌کا له قیامه‌تا که له قه‌بر هه‌ڵســـــا ، وا هه‌ڵه‌سیٚ ده‌رپێیێ لـه قه‌تران‌و کراسیٚ له گه‌ڕۆڵی له‌به‌را ئه‌بیٚ •

[ وا بیٚ به خه‌یاڵما که ئه‌م حه‌دیثه‌م نووسیبیٚ ]

وقال عمر ـ رضي الله تعالى عنه ـ دعهنّ يبكين على أبي ســـليمان ، ما لـم يكن نقع ، أو لقلقـة • والنقـع : التـراب على الرأس • واللقلقة : الصوت • ح ـ ٢/٣٨٨ •

**ته‌رجه‌مه :**

[ که خالیدی کوڕی وه‌لید ـ رضي الله تعـالى عنه ـ وه‌فـات ئه‌کـا له ته‌ئریخی بیسـت‌و سێدا ژنانی موغیره له سه‌ری ئه‌گرین ، عه‌رزی ئیمامی عومه‌ر کـرا ـ رضي الله تعالى عنـه ـ کـه : بنێره نه‌هیان بکه لـه گریان ] فه‌رمووی : وازیان لیٚ بێنه با = بۆ = ئه‌بوسوله‌یمان بگرین به‌و شه‌رته که خۆڵ به‌سه‌راکردن‌و ده‌نگی به‌رز نه‌بیٚ •

٢٩٤٦/٥٦ ـ عن المغيرة ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال : ســمعت النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ يقول : إن كذبا عليّ ليس كـكذب على أحد ، من كذب عليّ متعمداً فليتبوأ مقعده من النار ، سمعت النبي ـ صـلى الله تعالى عليه وسلم ـ يقول : من نيح عليه يعذب بما نيح عليه • ح ـ ٢/٣٨٨ ، م ـ ١/٢٩٥ ، م ـ ٤/٢٦٧ ، ت •

**ته‌رجه‌مه :**

موغیره ـ رضي الله تعـالى عنه ـ ئه‌فه‌رمویٚ : لـه پێغه‌مه‌ر ـ صلى الله تعـالى عليـه وسـلم ـم بیسـت ئه‌یفه‌رموو : درۆکردن بـه ده‌م منه‌وه وه‌ك

درۆکردن نیه بە دەم خەڵقەوە • هەرکەسێ بە عەمدەن درۆم بە دەمەوە بکا ئەو کەسە با جێی خۆی لە ئاگرا حازر بکا • لە پێغەمەرم بیست ـ صلی الله تعالی عیه وسلم ـ ئەیفەرموو : هەرکەسێ لە سەری بلاوێنرێتەوە ئەو کەسە بە لاوانەوە لە سەری عەذاب ئەدرێ • یەعنی ئەگەر وەصیەتی پێ‌کردبێ • یا ئەگەر عادەتیان بووبێ وەصیەتی بە تەرکی نەکردبێ •

٢٩٤٧/٥٧ ـ نعمان بن بشير ـ رضي الله تعالى عنهما ـ قال : أغمي على عبدالله بن رواحة ـ رضي الله تعالى عنه ـ فجعلت أخته عمرة [ وهي أم نعمان ـ رضي الله تعالى عنه ـ ] تبكي وا جبلاه ، وا كذا ، وا كذا ، تعدد عليه فقال حين أفاق : ما قلتِ شيئاً إلا قيل لي : آنت كذلك ؟ وفي أخرى خصري : فلما مات لم تبكِ عليه ح ـ ٦/٣٧١ •

**تەرجەمە :**

نوعمانی کوڕی بەشیر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ ئەفەرموێ : عەبدوڵڵای کوڕی رەواحەی خاڵم لە نەخۆشییێکا بێخود بوو ، عەمرەی خوشکی ، کە دایکمە ، ئەگریاو ئەیوت : وای بۆ کێوەکەم ، وای بۆ ئەوەم ، بۆ ئەوەم ، شەمائیلی هەڵئژمارد • کە هاتەوە هۆشی خۆی فەرمووی : هەرچییێکت وت لێیان ئەپرسیم : بۆ تۆ وایتە ؟ کە عەبدوڵڵا وەفاتی کرد بە شەهیدیی بۆی نەگریا •

**البكاء عند المريض(١) :**

٢٩٤٨/٥٨ ـ عن عبدالله بن عمر [ رضي الله تعالى عنهما ] قال : اشتكى سعد بن عبادة [ رضي الله تعالى عنه ] شكوى له ، فأتاه النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ يعوده مع عبدالرحمن بن عوف ، وسعد بن أبي وقاص ،

(١) گریان لای نەخۆشدا .

وعبدالله بن مسعود ـ رضي الله تعـالى عنهم ـ فلما دخل عليـه فوجده في غاشية أهله فقال : قد قضى ؟ قالوا : لا يا رسول الله ، فبكى النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ ، فلما رأى القوم بكاء النبي ـ صلى الله تعالى عليـه وسلم ـ بكوا • فقال : ألا تسمعون ؟ إن الله لا يعـذب بدمـع العين ، ولا بحزن القلب ، ولكن يعذب بهذا ـ وأشار إلى لسانه ـ أو يرحم ، وان الميت يعذب ببكاء أهله عليه • وكان عمر ـ رضي الله تعالى عنه ـ يضـــرب فيه بالعصا ، ويرمي بالحجارة ، ويحثي بالتراب • ح ـ ٢ ٣٩٩ ، م ـ ٤/٢٥٧ •

٢٩٤٩/٥٩ ـ وعنه قال : كنا جلوساً مع رسول الله ـ صلى الله تعـالى عليه وسلم ـ إذ جاء رجل من الأنصار فسلم عليه ثم أدبر الأنصاري ، فقال رســـول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ يا أخا الأنصــــار كيف أخي سعد بن عبادة ؟ فقال : صالح • فقال رســول الله ـ صـلى الله تعـالى عليـه وسلم ـ : من يعوده منكم ؟ فقام وقمنا معه ونحن بضعة عشر ما علينا نعال ، ولا خفاف ، ولا قلانس ، ولا قمص ، نمشي في تلك السباخ حتى جئناه ، فاستأخر قومه من حولـه حتى دنا رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ وأصحابه الذين معه • م ـ ٤/٢٥٨ •

**تەرجەمە :**

عەبدوللآی کوڕی عومەر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ ئەفەرموێ : لـە خزمەت پێغەمەرا ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ دانیشـــتبووین پیاوێ لـە ئەنصار هاتە خزمەتی سەلامی کرد • سەعدی کوڕی عوبادە ـ رضـــي الله تعالى عنه ـ نەخۆش بوو ، پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ لەو پیاوەی پرسی : ئەی برای ئەنصاریی سەعدی برام چۆنە ؟ عەرزی‌کرد : چاکـە • پێغەمەر ـ صلى الله تعـالى عليـه وسلم ـ فـەرمووی : لـە ئێوە کێ یێتـە

عەیادەتی ؟ تەشریفی هەڵساو ئێمەیش لە خزمەتیا چووین هەڵساین ، ئێمەیش ئەوەندەو دە کەس بووین ، هیچمان نەبوو نە نەعلمان بوو ، نە کەوشمان بوو ، نە قەلەنسوەمان بوو ، نە کراسمان بوو ، بە ناو ئەو ئەرزە ریکەلانیەدا ئەڕۆیین تا چووینە لای ، عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوفو ، سەعدی کوڕی ئەبووەقاصو ، عەبدوڵلای کوڕی مەسعوودیشی لە خزمەتا بوو ، کە تەشریفی چوە ئەوێ سەعد ـ رضي الله تعالی عنه ـ قەومەکەی لە دەورو پشتیا بوون ، پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ فەرمووی : تەواو بوە ؟ عەرزیانکرد : خەیر ( یا رسول الله ) پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ گریا کە خەڵقەکە چاویان پێکەوت کە پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ ئەگری ئەوانیش گریان ، پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ فەرمووی : گوێ بگرن ، خوا ـ عز وجل ـ بەمە ئینسان عەذاب نادا کە ئینسان فرمێسکی بێت ، بە حوزنی قەلبیش عەذابی نادا ، ئیشارەتی زمانی کردو فەرمووی : ئەمما بەمە عەذاب ئەدا یا خوا رەحمی پێ ئەکا • یەعنی ئینسان بە واسیطەی زمانی ئەکەوێتە عەذابەوە یا رەحمەتەوە • بە تەحقیق مردوو [ ئەگەر دەخلی بێ لەوەدا کە بە وەجهی غەیرە مەشرووع بۆی بگرین ] بە گریانی کەسوکاری عەذاب ئەدرێ •

ئیمامی عومەر ـ رضي الله تعالی عنه ـ بە دار ، بە بەردهاویتن ، بە خۆڵ بەسەراکردن لە سەر گریان لە خەڵقی ئەدا •

**زیارەتی قەبرو ژن لەگەڵ جەنازەدا چوون :**

٢٩٥٠/٦٠ ـ عن أم عطية ـ رضي الله تعالی عنها ـ قالت : نهينا عن اتباع الجنائز ولم يعزم علينا • ح ـ ٢/٣٨٠ ، م ـ ٤/٢٧٢ •

**تەرجەمە :**

ئوممو عەطییە ـ رضي الله تعالی عنها ـ ئەفەرموێ : نەهی‌کـراویـن = لەوە = کە لەگەڵ جەنازەدا بچینە سەر قەبران ، ئەمما لەســـــەرمان حەرامنەکراوە •

٢٩٥١/٦١ ـ عن عائشة ـ رضي الله تعالی عنها ـ قالت : كان رسـول الله ـ صلى الله تعالی عليه وسلم ـ كلما كانت ليلتها من رسول الله ـ صلى الله تعالی عليه وسلم ـ يخرج من آخر الليل الى البقيع فيقول : السلام عليكم دارَقَوْمٍ مؤمنين وأتاكم ما توعدون ، غداً مؤجلون ، وإنا إن شاء الله بكم لاحقون ، أللهم اغفر لأهـل بقيـع الغَرقدِ • ولم يقـل قتيبة = قوله = وأتاكم • م ـ ٣١٨/٤ •

**تەرجەمە :**

عایشە ـ رضي الله تعالی عنها ـ ئەفەرموێ : كوللی شەوێ لە نەوبەتی ئەوا پێغەمەر ـ صلى الله تعالی عليه وسلم ـ لە ئاخری شەوا تەشریفی ئەچوو بۆ بەقیع ئەیفەرموو : ئەی دیاری قەومی موسوڵمانان سەلامتان لەســـــەر بێ ، ئەوی کە سبەینێ وەعدەتان پێ‌ئەدرێ بە موئەججەلی وا بۆتان هات ، ئێمەیش ( إن شـــــاء الله ) ئیلتیحاق ئەكەین بـە ئێوە ، خوایا لە ئەهلی ( بقيع الغرقد ) خۆش ببە •

[ ئەمما خوا غەضەب بگرێ لە هەموو ئەصـــنافی غەششاش دوێنێ سەری ئەم شیشە مەرەکەبەم هەڵبچڕیوە ! ][1] •

٢٩٥٢/٦٢ ـ بريدة [ رضي الله تعالی عنه ] قال : كان رســـول الله ـ صلى الله تعالی عليه وسلم ـ يعلمهم إذا خرجوا الى المقابـر فكـان قائلهم

---

(١) دانەر ـ خ ـ گەلێ جار هاواری بەرز ئەبێتەوە لە دەست بێ‌کاغەزیو مەرەکەب خراپی ، ئەم جارە هاواری لە دەس غەشو فرو فێڵە .

يقول في رواية أبي بكر : السلام على أهل الديار • وفي رواية زهير : السلام عليكم أهل الديار من المؤمنين والمسلمين = والمسلمات = وإنا إن شاء الله للاحقون • أسأل الله لنا ولكم العافية = م ـ ٤/٣١٢ = •

**تەرجەمە :**

پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ تەعلیمی ئەوانەی کرد کە ئەچوونە سەر قەبران ئەم دۆعایە بکەن ـ دوو ریوایەت لە دۆعاکەدا هەیە ـ :

ئەبوبەکر ئەفەرموێ : پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ وایفەرموە کە بڵێین : سەلام لەسەر ئەهلی دیار بێ لە موئمینانو موسوڵمانان ، ئێمە ( إن شاء الله ) ئیلتیحاق ئەکەین بە ئێوە ، عافیەت لە خوا طەلەب ئەکەین بۆ ئێمەو ئێوە • لە ریوایەتی زوهەیرا سەلام لە سەر ئێوە بێ ئەی ئەهلی دیار ، سەلام لە سەر ئێوە بێ ئەی ئەهلی دیار •

٦٣/٢٩٥٣ ـ عن أبي هريرة [ رضي الله تعالى عنه ] قال : زار النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ قبر أمه فبكى وأبكى من حوله ، فقال ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ : استأذنت ربي في أن أستغفر لها فلم يأذن لي ، واستأذنته في أن أزور قبرها فأذن لي ، فزوروا القبور فإنها تذكركم الموت • م ـ ٤/٣٢٥ •

**تەرجەمە :**

پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ زیارەتی قەبری دایکی کرد ، گریاو ئەوانەیش کە لە دەورو پشتی بوون گریان ، لە پاشا فەرمووی : ئیذنم لە خوا خواست کە ئیستیغفاری بۆ بکەم ئیذنی نەدام ، ئیذنم خواست

کە زیارەتی بکەم ئیـذنی دام ، ئێوەیش زیارەتی قەبر بکەن ؛ چونکی مردنتان ئەخاتەوە فکر .

٦٤/٢٩٥٤ - بريدة - رضي الله تعالى عنه - قال : قال رسول الله - صلى الله تعالى عليه وسلم - : كنت نهيتكم عن زيارة القبور فزوروها[١] . م - ٤/٣٢٥ .

پێغەمەر - صلی الله تعالی علیه وسلم - فەرمووی : نەهیم لێکردن کە زیارەتی قەبر بکەن ، زیارەتی بکەن .

**عەیادەتی ئەهلی کیتابو تەلقینی :**

٦٥/٢٩٥٥ - عن أنس - رضي الله تعالى عنه - قال : كان غلام يهودي يخدم النبي - صلى الله تعالى عليه وسلم - فمرض فأتاه النبي - صلى الله تعالى عليه وسلم - يعوده فقعد عند رأسه ، فقال له : أسلم ، فنظر الى أبيه وهو عنده فقال له : أطع أبا القاسم - صلى الله تعالى عليه وسلم - فأسلم فخرج النبي - صلى الله تعالى عليه وسلم - وهو يقول : الحمد لله الذي أنقذه من النار ح - ٢/٤٣٧ .

**تەرجەمە :**

کوڕە جوولەکەیێ خزمەتی پێغەمەری ئەکرد - صلی الله تعالی علیه وسلم - نەخۆش کەوت ، پێغەمەر - صلی الله تعالی علیه وسلم - تەشریفی

---

(١) دانەر - خ - ئەم حەدیثەی بە تەواویی نەنووسیوەو ئەمە تەواوی‌یەکەیەتی : « ... ونهيتكم عن لحوم الاضاحي فوق ثلاث فأمسكوا ما بدا لكم ، ونهيتكم عن النبيذ إلا في سقاء فاشربوا في الاسقية كلها ، ولا تشربوا مسكرا » ئەمەیش لەبەر ئەوەیە کە ئەم حەدیثە رابورد .

